


کتێبخانەی **هیمە**



# سی ئامۆژگاریەکە

## بۆ فەرماندە و سەربازەکانی دەوڵەتی ئیسلامی

لە نوسینی شیخی موجاهید

**عبدالمنعم کوڕی عیزەدینی بەدەوی**

**ئەبو حەمزەی موهاجیر**

# سی ئامۆژگاریەکە

## بۆ فەرماندە و سەربازەکانی دەوڵەتی ئیسلامی


لە نوسینی شیخی موجاهید

**عبدالمنعم کوڕی عیزەدینی بەدەوی**

**ئەبو حەمزەی موهاجیر** رحمه الله



مكتبة الهمة

کتێبخانەی **هیمە**

الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله وصحبه ومن والاه، وبعد:

لەڕاستیدا هەموو ووشەیەک ناگاتە دڵی کەسانی دی تاکو کاری تێبکات وپاڵهێزی بۆ دابین بکات؛ ئەگەر ئەو ووشەیە خوێنی لێ نەتکێ، چونکە هەموو ووشەیەکی زیندوو لەسەر دڵی مرۆڤی زیندوو ژیاوە، بەڵام ئەو ووشانەی کە لە دەمەکانەوە لەدایک بوونە و زمان پاڵی پێوە ناوە و لەپێناویدا قوربانی نەدراوە؛ ئەوا بەمردوویی لەدایک بووە.[1]

ئێستاش -ئەی برای موجاهیدم- ووشەگەلێکمان بۆ هەڵبژاردووی پڕە لە نوور، کە لەدڵی یەکێک لە پێشەواکانی دەوڵەتی ئیسلامییەوە دەرهاتووە، ئەو وەزیر ئەبو حەمزەی موهاجیرە کە شەهید بوو -بإذن الله-، ئەوەی کە خوێنی ڕژا لەسەر خاکی ڕافیدەین و ووشەکانی هەستانەوە و زیندووبوونەوە لەدڵی ئەوانەی خۆشیان ویستووە.

لەپاش پێنج ساڵ لە کوژرانی شێخ، الله تعالى ئاسانی کرد سی وەسێتەکەی بۆ فەرماندە وسەربازەکانی دەوڵەتی ئیسلامی چاپ بکرێت لە چاپخانەکانی (کتێبخانەی هیممە)، بۆئەوەی سوودی لێ وەربگیرێت و نەوەکانی شێخ وبراکانی لەسەر پەروەردە بکرێ ئەوانەی کە سەکۆی خیلافەتی ئیسلامییان دامەزراند، دەسا داواکارین لە

(١) لەوتەکانی سەید قوتبە رحمه الله لە کیتابی (دراسات إسلامية).

الله ﷻ ئەوەی موهاجیر نوسیویەتی بیخاتە ناو کێشانەی کارە چاکەکانییەوە، هەروەها بیکاتە مایەی سوود وەرگرتنی موجاهیدان بە فەرماندە وسەربازەوە.

## پێشەکی نووسەر

بسم الله الرحمن الرحيم
الحمد لله، والصلاة والسلام على رسول الله، وعلى آله ومن والاه، أما بعد:

**ئەی برای موجاهیدم:**
ئەمە هەندێك ئامۆژگارییە، بۆ تۆم کۆکردۆتەوە لەدەمی پیاوان وناخی کتێبەکان، وە بانگەێشتی دانایی بۆخۆم ناکەم، وداواکارم لە الله کە سوود بە من وئێوەشی پێ بگەیەنێ، بەتەنها الله لەپشتی مەبەستەکانەوەیە.

## ئامۆژگاری -1-

دڵسۆزی بۆ الله؛ لەمەدا ڕزگاربوونی دونیا ودوواڕۆژ هەیە: پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (الله بووەتە کەفیلی هەرکەسێ جیهاد بکات لەپێناوی خۆیدا کە هیچ دەری نەهێنابێت جگە لە جیهاد لەپێناو خۆیدا وبەڕاست دانانی ووشەکانی بەوەی بیخاتە بەهەشتەوە یان بیگەڕێنێتەوە بۆ ئەو ماڵەی لێوەی دەرچووبوو لەگەڵ سەرجەم دەستکەوتەکانی بە پاداشت و غەنیمەتەوە) ([1]).

هەروەها مەبەستت لەکارەکەتدا بەرزکردنەوەی ووشەی الله بێت تاکو بەرزترین ئاست؛ لە ئەبو موسای ئەشعەریەوە ﵁ دەڵێت: سُئِلَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ عنْ الرَّجُلِ يُقَاتِلُ شَجَاعَةً، وَيُقَاتِلُ حَمِيَّةً، وَيُقَاتِلُ رِيَاءً، أَيُّ ذَلِكَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ ﷺ : (مَنْ قَاتَلَ لِتَكُونَ كَلِمَةُ اللَّهِ هِيَ الْعُلْيَا فَهُوَ فِي سَبِيلِ اللَّهِ).

پرسیارکرا لەپێغەمبەر ﷺ دەربارەی پیاوێک کوشتار دەکات بۆ ئازایەتی، یان کوشتار دەکات بۆ دەمارگیری، یان کوشتار دەکات بۆ ڕیابازی، کام لەوانە لەپێناو (الله)یە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەرکەسێ کوشتار بکات بۆئەوەی ووشەی الله بکاتە بەرزترین ئاست ئەوا لەپێناو (الله)یە).

١ متفق عليه.

## ئامۆژگاری -2-

دادپەروەری وئامۆژگاری بۆ ژێردەستەکانت: چونکە (هیچ فەرماندەیەک بەسەر دە کەسەوە نییە ئیلا لەڕۆژی دووایی‌دا بە قۆڵبەست کراوی ئەهێنرێت کە هیچ ئازادی ناکات جگە لە دادپەروەری یان ستەمکاریەکەی لەناوی ئەبات) ([2])، وە (هیچ فەرماندەیەک نییە کە کاروباری موسڵمانانی پێ بسپێردرێ پاشان خۆی بۆیان ماندوو نەکات وئامۆژگاریان نەکات ئەوا ئیلا لەگەڵیاندا ناچێتە بەهەشتەوە) ([3])، وە (اللە ژێردەستە بەهیچ بەندەیەک ناسپێرێ ئەمرێ لەکاتی مەرگیدا لەکاتێکدا گزی کردبێ لە سپاردەکە ئەوا ئیلا اللە بەهەشتی لەسەر حەڕام ئەکات) ([4]).

## ئامۆژگاری -3-

ڕاوێژکاری وچاوپێکەوتن: چونکە چاوپێکەوتن لقێکی ڕاوێژکارییە، واتە: دانیشتن بۆ پێشکەشکردنی بیرۆکەکان لە دانیشتنەکەدا، وگفتوگۆکردنی هەموو کەسێک لەسەر ڕای ئەوی تر، یان پێشکەشکردنی بیروڕایەکی نوێ، پاشان لەکۆتاییدا بیروڕای دروست پەسەند ئەکرێ، اللە تعالى ئەفەرمووێت: {وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ} [آل

٢ موسلیم گێڕاویەتیەوە.

٣ متفق علیە.

٤ متفق علیە.

عمران: 159]؛ ئەوەتا الله تعالی ئاماژە بە پێغەمبەرەکەی دەکات بۆئەوەی ڕاوێژ بکات لەگەڵ کەسانێک کە لەژێر خۆیەوەن سەرەڕای ڕاست ودروستی ئەقڵی پێغەمبەر ﷺ چی جا ئێوە؟

وە هەروەک وتراوە: "پەشیمان نابێتەوە ئەو کەسەی ڕاوێژ بەخەڵکی دەکات، وشکست ناهێنێ هەرکەسێ الله بکاتە هەڵبژێرەر بۆخۆی"، وە وتراوە: "هەرکەسێ دڵخۆشبێ بە ئەقڵی خۆی گومڕا ئەبێ، و هەرکەسێ تەنها ڕای خۆی پەسەند بکات هەڵە دەکات، وهەرکەسێ ڕاوێژ بەکەسانی خاوەن ژیری بکات بکات ڕێگای ڕاست ئەگرێتەبەر، وهەرکەسێ هاوکاری وەربگرێ لەخاوەن ئەقڵەکان ئەوا سەردەکەوێ بەزانینی ئەنجام".

کەواتە پێویستە هەموو فەرماندەیەک ئەنجومەنێکی ڕاوێژکاری ڕاستەقینەی هەبێت، بە دەستپێک لە فەرماندەی گشتییەوە وکۆتایی بە فەرماندەی سەرایاکان.

بەڵام ڕاوێژ بەکەسێک مەکە کە بەرژەوەندیەکی هەیە وئەیەوێ بیهێنێتەدی، یان کەسێک کە هەست بکەی چاوی تێ بڕیوە، یان کەسێک کە بیرۆکە تێکەڵاوی بیروڕا نەکات؛ هەروەک وتراوە: (وازبێنە لە بیروڕا هەتا هەڵئەچێت)، هەروەها هاتووە لە پێشەوا عەلی یەوە رضي الله عنه: (ڕای پیرەمێرد چاکترە لە دیمەنی مێرمنداڵەکە) ([5])؛ واتە لەکاتی کوشتار.

---

٥ بەیهەقی دەریهێناوە لە سونەنەی کوبرا.

و ڕاوێژکاری مەکە مەگەر لەکاتی تەنهاییدا: چونکە ئەمە چاکترە بۆ پاراستنی نهێنی، وڕێکو پێکترە ئەگەر کەسێک بیەوێ ئاشکرای بکات.

بەڕاستی! "ڕاوێژکاری وچاوپێکەوتن دەرگایەکی ڕەحمەتە وکلیلێکی بەرەکەتە بەهۆیەوە بیرورا گومڕا نابێت"(6) .

## ئامۆژگاری -4-

دووربە لەوەی مەرکەسێ تەنها لەبەرئەوەی بیروڕایەکەی هاوڕای خۆت بوو پەسەندی بکەی، و وریابە لە ناخ پیسی، وە ناخی خۆت ڕابهێنە لەسەر ئارامگرتن لەسەر مەرکەسێکی ئامۆژگاریکار کە بیروڕاکەی جیاوازبوو لەگەڵ ڕای خۆت، وتامی تاڵی وتە ولۆمەیان بچێژە، وخۆت فراوان مەکەرەوە مەگەر بۆ خاوەن فەزڵ وئەقڵ و بەتەمەن وبێ کەموکوڕی ونهێنی پارێزەکان.

## ئامۆژگاری -5-

لەڕاستیدا هیچ شتێ دین ودونیا نافەوتێنێ زیاتر لە بێئاگایی فەرماندە لەمەواڵی خەڵکەکەی خۆی، دەسا خۆتیان لێ ون مەکە،

---

٦ لە عومەری کوڕی عەبدولعەزیز هاتوە لە (أدب الدنيا والدين)ی ماوردی، و غەیری ئەویش.

چونکە لەڕاستیدا تۆ مرۆڤیت ونازانی خەڵکی چیت لێ ئەشارنەوە، دووربە لەبیانوو هێنانەوە بە ئارامی وئاشتی؛ هەست بەئارامی بکەیت وخەڵکەکەی خۆت ون بکەی؛ ئەگەرنا بەوجۆرە ئەبیتە خراپترین فەرماندە.

هەروەها لەسەر هەمووشتێک بەخۆت بوەستە لەپاش سپاردنی کارەکە بە ئەمینداره ئامۆژگاری کارەکان؛ چونکە ڕەنگە ئەمیندار خیانەت بکات وڕەنگە ئامۆژگاری کارەکان گزی بکەن کەواتە دامەزراوبن لە کاروبارەکاندا؛ الله تعالى دەفەرمووێت: {يَا دَاوُدُ إِنَّا جَعَلْنَاكَ خَلِيفَةً فِي الأَرْضِ فَاحْكُمْ بَيْنَ النَّاسِ بِالْحَقِّ وَلا تَتَّبِعِ الْهَوَى فَيُضِلَّكَ عَنْ سَبِيلِ اللَّهِ} [ص: 26]، واتا: (ئەی داود: بەڕاستی ئێمە تۆمان کردۆتە جێنشین لەم وڵاتەدا، فەرمانڕەوایی لە نێوان خەڵکدا لەسەر بنچینەی حەق و ڕاستی ئەنجام بدە، هەرگیز شوێنی ئارەزوو مەکەوە، تا نەبێتە هۆی گومڕاکردن و لادانت لە ڕێبازی الله)، (کەواتە بۆچی الله تعالى کورتی نەکردەوە لەسەر پێکدادانی دور، وە بیانوی بۆ نەهێنانەوە تەنیا بە سەرقاڵکردن تا ئەوەی لە گومڕایانی دانان).[7]

وە پەلە مەکە لە باوەڕکردن بە هەواڵ هێنەرێک کە خراپکاری دەوێ، چونکە ئەو هاوشێوەی گزیکارە هەرچەندە ئەگەر خۆی بچووێنێت بە ئامۆژگاریکاران، هەروەها وتەکەی پشتگوێ مەخە؛ چونکە ڕەنگە

---

٧ ماوردی وەری گرتوە لە: بدائع السلك في طبائع الملك لابن الأزرق.

ڕاستگۆ بێت، وە گومانی چاک ببە بە براکانت؛ چونکە بەڕاستی گومانی چاک ناخۆشی وبۆسەی دووورودرێژت لەسەر لادەبات.

## ئامۆژگاری -6-

پێویستە لەسەر فەرماندە کە خۆی و سەربازەکانی دەستبگرن بەوانەی اللە تعالی واجبی کردوون لەسەرجەم مافەکان، وەهەرچی فەرمانێکی کردووە لە حەددەکان: "چونکە هەرکەسێ جیهاد بکات لەسەر دینەکەی ئەوا خۆی لەپێشترین کەسە بۆ پارێزگاریکردن لە حوکمەکانی دین" ([8])، بەڵام تۆ ناتوانی خەڵکی چاک بکەیتەوە لەکاتێکدا تۆ خۆت خراپکار بیت، وە تۆ ناتوانی خەڵکی ئاڕاستەبکەی لەکاتێکدا تۆ خۆت سەرلێشێواو بیت، وە تۆ هیدایەتی کەسی تر نادەیت لەکاتێکدا خۆت گومڕا بیت، جا چۆن نابینا توانای هیدایەت بەخشینی دەبێ، جا چۆن زەلیل عیززەت ئەبەخشێ؟ وە زەلیلتر نییە لە زەلیلی تاوان وسەرپێچی، وە شکۆمەندتر نییە لە شکۆی بەندایەتی، دەسا دەستهەڵگرە لە برسییەکانی ڕەوشت یان هاوڕێیەتی خراپکاران.

## ئامۆژگاری -7-

دووربە لەوەی نارەحەتی بارودۆخت لەشتێکدا پاڵت پێوە بنێ لە داواکردنی شتەکە بەناهەق؛ چونکە ئارامگرتنت لەسەر نارەحەتیەک

---

٨ ماوردی هێناویەتی لە پەرتوکی (الأحكام السلطانية).

کە ئومێدی هاتنەدی بکەیت وفەزڵێک کە سەرەنجامەکەی چاکتربێ لە سەرپێچییەک کە ترسی سەرپێچی دووای خۆی هەبێت، وە دین لەخولگەی ئارامگرتن ئەسوڕێتەوە.

## ئامۆژگاری -8-

دووربە لەوەی خۆت جیاواز بکەی بە سەیارە یان جلوبەرگ؛ عومەر بۆ ئەبو موسای ئەشعەری نووسی: (... بەڕاستی پێم گەیشتووە کە جلوبەرگ وخواردن وئەسپەکانت خۆت وخانەوادەت ناوی داوەتەوە، وە موسڵمانانیش هاوشێوەی ئەوەیان نییە، دەسا ئەی بەندەی اللە دووربە لەوەی خۆت بگەیەنیتە ئاستی ئاژەڵێک کاتێک ئەگاتە دۆڵێکی پڕ بەرەکەت، کە هیچ خەمێکی نامێنێ جگە لە خۆقەڵەو کردن، بەڵام لەڕاستیدا مەرگی خۆی لە قەڵەوبوونەکەیدایە، وە چاک بزانە کە ئەگەر کارگوزار لەڕێ دەرچێ ئەوا ژێردەستەکانیشی لەڕێ دەردەچن، وە سەرپێچی کارترین کەس ئەو کەسەیە کە بەهۆی خۆیەوە ژێردەستەکانی دوچاری سەرپێچی دەبن).[9]

## ئامۆژگاری -9-

بزانن کە جەنگ -هەروەک ووتراوە-: قورساییەکەی ئارامگرتنە، وە

9 پاڵدراوە بۆ (کنز العمال)ی دەینوری، وە ئیبن ئەبو شەیبە لەم شێوە هێناویەتی لە موصەنەفەکەی.

جەمسەرەکەی پیلانە، وە خولگەکەی ئیجتیهادە، وە ئەزمونەکەی لەسەرخۆیەتییە، وە پێشڕەوەکەی ووریاییە، وبۆ هەموو شتێ لەمەدا بەرهەمێک هەیە؛ وە بەرهەمی ئارامگرتن پشتگیرییە، وە بەرهەمی گزی سەرکەوتنە، وە بەرهەمی ئیجتیهاد سەرفرازییە، وە بەرهەمی لەسەرخۆیی ئارامی دڵە، وە بەرهەمی ووریایی ئاشتییە.

پرسیارکراوە لە عەمرِی کوڕی مەعدیکریب([10]) دەربارەی جەنگ ئەویش گووتی: (هەرکەسێ ئارامبگرێ تێیدا ناسراوە، وهەرکەسێ بترسێ لەسەری ئەفەوتێ)([11])، دەسا دووربن لە پەلەکردن، چونکە ڕەنگە پەلەکردن پەشیمانی بەدوادابێ.

## ئامۆژگاری -10-

ئەهلی بەلاء وتووندوتۆڵ لەسەر دوژمن بخە پێشەوە لەکاتی بەیەکگەیشتن وکوشتار، وە دابەشیان بکە بەسەر سەراياكان بۆئەوەی لاوازەکان بەهێز بکات، بۆئەوەی ترسنۆک بە ئازایەتی ئەوانەوە بەجەرگ بن، وە دووربە لەوەی پەشیمان کەرەوە یان وورە ڕوخاوێک هاوڕێیەتی براکانت بکات.

وە زۆر زۆر ووریابە لە چاوەکان وسیخوڕەکان، چونکە چەندین کۆمەڵی

١٠ یەکێك لە هەواڵە پاڵەوانەکانە (الله لێی ڕازی بێت).

١١ پاڵدراوەتە لای بەلاذوری لە (فتوح البلدان).

کەم سەرکەوتوون بەسەر کۆمەڵی زۆر بەئیزنی الله، بەڵام ڕیزەکان پڕ مەکە لە بەهێزەکان لەکاتێکدا لاوەزە دڵ گەشاوەکان بە بەدەستهێنانی پاداشتی الله بێ بەش بکەی؛ چونکە پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (جا ئایا سەردەکەون ورزقتان پێ ئەدرێ بە جگە لە لاوازەکانتان)([12])، وە بەڕاستی الله گەلانێک سەردەخات بە لاوازترینیان.

## ئامۆژگاری -11-

بێ ئاگا مەبە لە کەرەستەکان کە ئەتوانرێ هەڵبگیرێ وەکو قەڵغان و کڵاوی سەربازی، ئەمە لەبەر ترسنۆکی نییە، چونکە بەجەرگترین کەس پێغەمبەر ﷺ قەڵغانی هەبووە، وە ئەمەش نابێتە ڕێگر لە کوشتار کردن بەبێ قەڵغان لەکاتی گونجاوی خۆیدا، حەبیبی کوڕی مهلب دەڵێ([13]): (هیچ پیاوێکم نەدیوە قەڵغانی پۆشیبێت زیاتر لە دوو پیاوم لابوو، وهیچ دوو بێقەڵغانم نەدیوە ئیلا یەکێکیانم لەلا بووە). ئینجا هەندێ لە ڕۆشنبیران ئەم باسەیان بیست وگوتیان: (ڕاستە! بەڕاستی چەک گرنگە؛ ئایا نایانبینی هاوار دەکەن ودەڵێن: چەک چەک، کەچی ناڵێن: پیاو پیاو).([14])

---

١٢ بوخاری گێڕاویەتیەوە.

١٣ حەبیبی کوڕی موهەلەبی کوڕی ئەبو صوفرە، یەکێکە لە ئازاکانی عەرەب و بەشکۆیەکانی لەسەر دەمی مەڕوان هەروەك هاتووە لە پەرتوکی (الأعلام)ی زەرگەلی.

١٤ (عیون الأخبار) لەنوسینی قوتەیبە دەینوری.

## ئامۆژگاری -12-

بەڕاستی فەرماندەی دانا ئەوەیە کە براکانی هێدی ئەکاتەوە بە پێدانی خواردن وخواردنەوە بۆ بەهێزکردنی ناخ ودەروونیان بەدرێژایی ڕۆژ؛ وە هەندێ لە فەرماندەکانی جەنگ لەئەفغانستان ئەگەر گیرفانەکانی بپشکنین مێووژمان ئەدۆزییەوە.

## ئامۆژگاری -13-

پێویستە لەسەر فەرماندە کە بۆهەموو مەفرەزەیەک فەرماندەیەک دەستنیشان بکات، وە ئۆتۆمبێل وچەکی براکانی وشوێنی حەوانەوەیان بپشکنێ، بەتایبەت لەپێش غەزوە وهێرشبردن، وە شتێکی تێ نەکات کە لەکاتی ڕاستی وناڕەحەتی ببێتە کۆسپ بۆ براکانی، وە شتێکی لێ بێبەش نەکات کە پێویستیان بێت لەکاتی تەنگانە ودوورودرێژی ڕێگاکە، بەتایبەت ئەگەر هەست بکات کە جەنگەکە درێژە ئەخایەنێ.

## ئامۆژگاری -14-

پێویستە لەسەری ژمارەی سەربازەکان لە سێ کەس زیاتر نەکات لەناو یەک ئۆتۆمبێلدا، ئیلا ئەگەر بەرژەوەندی تێدا بێت، وە دڵنیابێت لە پەیوەندیەکی ئەمنی پشکنراو لەنێوان سەرایاکان، وە ووشەی نهێنییان بۆدابنێ تاکو گفتوگۆی پێ بکەن، هەروەها دروشمێک بۆ جەنگەکەیان دابنێت.

## ئامۆژگاری -15-

پێویستە لەسەر فەرماندە کە ووتار بدات بۆژێردەستەکانی خۆی وسەربازەکانی بەجۆرێک دەروونیان بەهێز بکاتەوە، وە هەستی سەرکەوتن بەسەر دوژمنیان پێ ببەخشێ، وە باسی هەندێ بەسەرهاتیان بۆ بکات لەهۆکارەکانی سەرکەوتن کە بەهۆیەوە دوژمنیان لەپێش چاو بچووکەوە ببێت، الله تعالى ئەفەرمووێ: {إِذْ يُرِيكَهُمُ اللَّهُ فِي مَنَامِكَ قَلِيلا وَلَوْ أَرَاكَهُمْ كَثِيرًا لَفَشِلْتُمْ وَلَتَنَازَعْتُمْ فِي الأَمْرِ} [الأنفال: 43]. واتا: (کاتێک الله ئەوانی لە خەونتدا بەکەم نیشان ئەدایت، خۆ ئەگەر ئەوانی بەژمارەیەکی زۆر نیشانی بدایتایە ئەوە ئێوە لاواز دەبوون و تووشی نەهامەتی و کێشە دەبوون لە بارەی جەنگ کردنەوە).

## ئامۆژگاری -16-

پێویستە لەسەر فەرماندە گۆڕەپانی جەنگ بەباشی بخەملێنێ، وە لە شوێنێکەوە کوشتار نەکات کە بەئاسانی بەدەوریدا بسوڕێنەوە بەبێ ئەوەی هیچ سەنگەرێکی گرتبێ، وە سەربازەکانی خۆی زۆر دوور نەکاتەوە بەجۆرێک گەڕانەوەیان بەسەلامەتی ئەستەم بێت.

## ئامۆژگاری -17-

پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: (جەنگ هەڵخەڵەتاندنە).[15]
هەروەها موهەللەب[16] دەڵێت: (دەستبگرن بە فروفێڵەوە لە جەنگدا؛ چونکە ئەوە چاکترە لە فریاگوزاری).

**هەندێ لەو فێڵکردنانە:**
أ- بڵاوکردنەوەی سیخوڕ.
ب- وبەدەستهێنانی هەواڵ.
ج- پێکانی دوو ئامانج لە جەنگ وغەزوەکاندا؛ پێغەمبەر ﷺ ئەگەر غەزوەیەکی بکردایە مەبەستی لە یەکێکی دی ئەبوو.

إذا ضاقَ صدرُ المرءِ عن سرِّ نفسِه
فَصَدْرُ الذي يُسْتَوْدَعُ السرَّ أَضْيَقُ

**وە وریابە لە دوژمنەکەت لەسەرهەموو حاڵەتێک نەکا:**
أ- لەنزیکترین کات هەڵبسێتەوە.
ب- یان دوورییەکەی بگۆڕێ.

---

١٥ (متفق عليه)
١٦ موهەللەبی کوڕی ئەبو صوفرە ئیبن حەبان باسی کردوە لە تابیعیە جێگە متمانەکان وە گوتی: (... بوو بە والی خۆراسان لەلایەن حەجاجەوە بۆ ماوەی نۆ ساڵ، وە ئیبن صبیة گوتی: لەئازاترینی خەڵکی بوو) بگەڕێوە بۆ: (التهذيب) لەنوسینی ئیبن حەجەری عەسقەلانی.

ج- یان بۆسەیەک دابنێ لەچاکترین شوێن.
د- یان دواتر بێتەوە لەپاش گەڕانەوە.

## ئامۆژگاری -18-

یەکێک لەنیشانەکانی شارەزایی فەرماندە ودانایيەکەی بریتییە لە قۆستنەوەی هەل؛ (چونکە تێدەپەڕێ وەکو تێپەڕبوونی هەورەکان، وە داوای پاشماوەی پشتی چاو مەکەن)([17])، هەستەوە لەلای سەری کارەکە نەک هەستیتەوە لەلای کلکەکەی.

إذا هبَّتْ رياحُك فاغتنمها
فإنَّ لكلِّ خافقةٍ سكونُ

## ئامۆژگاری -19-

دروستە فەرماندەی سووپا تامەزرۆکانی شەهیدبوون بخاتە پێشەوە ئەگەر بزانێ کە کوژرانی ئەو لەجەنگەکەدا ئەبێتە مایەی ماندانی موسڵمانان لەسەر کوشتار کردن، هەروەها پێچەوانەکەشی دروستە؛ واتە ئەو کەسانە بپارێزێ کە بە کوشتنیان وورەی براکانیان ئەڕوخێ؛ بۆنموونە پێشەوایەکی تایبەت؛ هەربۆیە پێگەی دڵ پارێزراوترین پێگەکانە ودوورترینە لە دوژمن.

---

١٧ پاڵدراوە بۆ ئیبن وعەبد ڕەبەی ئەندەلوسی بۆ عەلی (الله لێی ڕازی بێت) لە کیتابی (العقد الفريد)، بەهەمان شێوە لە پەرتوکی (بدائع السلك)، وە النويری لە کیتابی (نهاية الأرب في فنون الأدب).

## ئامۆژگاری -20-

ڕێگە مەدە براکانت بکوژرێن یان بەدیل بگیرێن کە ڕەنگ بێت ڕیزەکە بەهۆیانەوە بەش بەش ببێتەوە وە ووشەیان بەهۆیەوە جیاواز ببێتەوە، تەنانەت ئەگەر درووستیش بێت بەجۆرێک لە جۆرەکان؛ چونکە یەکبوونی ووشە لەکاتی جەنگدا بەرژەوەندییەکی چاکە لەهەمووشتێ چاکترە.

## ئامۆژگاری -21-

دووربن لەخوێن، دووربن لەڕشتنی خوێنی ناهەق؛ چونکە هیچ شتێک لەڕشتنی خوێنی ناهەق خێراتر نییە بۆ هێنانی برسییەتی ونەهێشتنی ڕۆزی، وە دووربە لەوەی خۆت وسەربازەکانت بەهێز بکەی بەهۆی خوێنی حەرامەوە؛ چونکە ئەوە تەنها بۆ ئێستایە بەڵام داهاتووەکەی لاوازی وبێنرخی دەبێ، کەواتە بیانووت نییە لەلای الله ونە لەلای ئێمەش، وە سوێند بە الله هەر خوێنێکی ناهەق لەئەهلی سوننەمان پێ بگات بەبێ ڕوونکردنەوەی هۆکاری ڕشتنی خوێنەکە بەهۆکارێکی شەرعی وبەبێ شک وگومان؛ ئەوا ئیلا تۆڵەی ئەکەینەوە.

## ئامۆژگاری -22-

نەخەڵەتێی بە چاڵاکیەکی ئاسان؛ ڕەنگە لێژاییەک کۆتاییەکەی نارەحەت بێت؛ لەبەرئەوە پێویستە بیرو هۆشت بەکاربهێنی بۆ ئەمڕۆ

و سبەی؛ چونکە لەفەرماندەیەک خراپتر نییە بۆخەڵکی کەتەنها بیر لە ڕۆژی ئامادە بکاتەوە.

## ئامۆژگاری -23-

خەڵاتی چاکەکار بکە لەچاکەکانیدا، وە خەڵاتی ڕێزلێنان ببەخشە بە دەستە وسەرایاکان لەپاش سەرکەوتن، وە ڕێزدابنێ لە ئازا وبەجەرگەکان لەبەرچاوی خەڵکی، ولەبەرامبەریشدا؛ سزای خراپەکار بدە لەخراپەکانیدا هەرچەندە ئەگەر بە قسەنەکردن وعاجز بوونیش بێت؛ چونکە دروستە فەرماندە سەرپێچیکاری فەرمانەکانی خۆی سەرزەنشت بکات، چونکە ئەگەر ئەوها نەکەی؛ چاکەکار کەمتەرخەم ئەبێ وخراپکار زمان درێژی ئەکات وفەرمانەکە پوچەڵ ئەبێتەوە وکارەکە ئەفەوتێ.

وە پێویستە مامەڵەی چاکت بۆ چاکەکار ئاشکرا بێت، وە سزادانت بۆ خراپەکار نهێنی بێت؛ بەتایبەت بۆئەهلی فەزڵ تیایاندا، بەڵام ئەهلی تێکدەران پێویستە لەبەرچاوی خەڵکی بێت، ئەمەش لەشەریعەتدا هاتووە.

وە زۆر زۆر دووربە لەزیادەڕەوی لەسزادان، یان پەشیمانی لەسەر داوای لێخۆشبوون، وە دووربە لەتووڕەیی لێدابڕان؛ چونکە شەریعەت سزای داناوە بۆئەوەی چاکبکاتەوە نەک بۆئەوەی ئابڕوو ببات.

وە وووریابە لەوەی لەکاتی تووڕەییدا ووشەیەك بەکاربهێنی کە

نەگەڕێتەوە؛ چونکە ڕەنگە ووشەکە بەخاوەنەکەی بڵێ: (وازم لێ بێنە).

وەهەروەها تۆ -ئەی فەرماندە- قسەکانت مەکەرە زۆربڵێیی سەرزەنشت وە نەلێخۆشبوونی تەواوەتیش، وە ئەو سنوورە مەبەزێنە لەسزاکەت کە الله بۆتی داناوە -بەدەستدرێژی یان خۆشیی وئارەزوو-، چونکە- (ستەمکاری تاریکایییە لەڕۆژی دووایی) ([18])، دەسا براکەم دەستبگرە بە نەرم ونییانییەوە لەسەرجەم کاروبارەکانتدا تەنانەت لە سزاکانیشت.

الله تعالى ئەفەرمووێ: {وَلَوْ كُنْتَ فَظًّا غَلِيظَ الْقَلْبِ لَانْفَضُّوا مِنْ حَوْلِكَ} [آل عمران: 159]، واتا: (ئەی پێغەمبەر ئەگەر تۆ کەسێکی توڕە وتوند بویتایەوە وقسەت ناخۆش بووبا ئەوە دەورەت چۆڵدەکرا)، هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێ: (هەرکەسێ بەشی بدرێ لەنەرم ونییانی ئەوا بەشی دراوە لە چاکە وەهەرکەسێ بێبەش بکرێ لەنەرم ونییانی ئەوا بێبەش بووە لەچاکە) ([19])، هەروەها ئەفەرمووێ : (بەڕاستی ئەم دینە زۆر بەهێزە بچنە ناوی بەنەرمی).([20])

---

١٨ موسلیم گێڕاویەتیەوە

١٩ ترمذی گێڕاویەتیەوە وە دەڵێت: فەرمودەیەکی چاکی دروستە.

٢٠ ئەحمەد گێڕاویەتیەوە: وە شوعەیب ئەرنەئوت دەڵێت: چاکە وسەنەدەکەی لاوازە.

## ئامۆژگاری -24-

بزانە کە براکانت گوێڕایەڵن وجێبەجێکارن داواکاری پاداشتی لای (الله)ـن؛ کەواتە کارکردنیان شەرعی وڕەووشتییە زیاتر لەترسی دەسەڵاتدار؛ کەواتە هیچ کەسێ تەمبێ مەکە ئیلا ئەوکەسەی کەوا مەستەکەی دینێکی مەیە قبوڵی ئەکات، بەڵام مەرکەسێ ئەزانی کە ئاینەکەی ئاوایە کە سزای بدەی قبوڵی ناکات نەکەی تۆ سزای بدەی، بەڵکو بەنەرمی وفێرکارییەوە؛ چونکە لێخۆشبووترین کەس بەتواناترینە لەسەر سزادان، وە کەم ئەقڵترین وبێتواناترین کەس ئەو کەسەیە کە ستەمدەکات لەکەسانی خوار خۆیەوە، کەواتە دادپەروەربە بۆ الله وە دادپەروەری خۆت بۆخەڵکی وخانەوادەکەت ومەرکەسێ خۆشتدەوێ لەبراکانت وژێردەستەکانت بسەلمێنە، وە ئەگەر ئەوما نەکەی ئەوا ستەم ئەکەیت، وە مەرکەسێ ستەم بکات لەبەندەکانی الله ئەوا الله دەبێتە دوژمنی، وە مەرکەسێ الله ببێتە دژی ئەوا جەنگی لەسەر دەبێ مەتا تەوبە دەکات ودێتەدەر، دەسا خۆت بپارێزە لەنزای ستەملێکراو؛ چونکە لەنێوان ئەو و الله هیچ بەربەستێک نییە، وە بەڕاستی دەرگاکانی بەمەشت بۆی کراوەن، وە کاتژمێرێک لەڕۆژدا بۆخۆت تەرخان بکە تێیدا بیربکەوە ئایا ستەمت لەهیچ کەسێ کردووە، یان ئایا هیچ ستەملێکراوێک مەیە کە پێویست بکات سەریبخەی؟ وەمەرکەسێ تووڕەیی (الله)ی دەوێ ئەوا با ستەم بکات!

## ئامۆژگاری -25-

براکانت وخەڵکی بەدەستبهێنە بەچاکەکردن تاکو دڵیان بەدەستبهێنیت؛ چونکە بەردەوامی خۆشەویستی بەچاکەکارییە، وە نەمانی بەبێباکییە، وە دۆستایەتی خەڵکی گشتی خۆشەویستی ئەوانت بۆ دابین ئەکات، وە ڕێزیان لێوە بەدەست ئەهێنیت؛ چونکە دۆستایەتی لەبەهێزەکانەوە لەسادەییەوەیە.

هەروەک عومەری کوڕی عەبدولعەزیز نەرمی ئەنواند لەبۆ خەڵکی جا بە چاکترین نەرمی؛ هەرکاتێ فەرمانێکی (الله)ی بویستبا کە هەستی بکردبا خەڵکی پێیان ناخۆشە ئەوا چاوەڕوانی ئەکرد هەتا ئەوەی ئەهێنا کە خەڵکی پێیان خۆشبوو وە بەیەکەوە ئەنجامی دەدا، هەر لەوەوە هاتووە: (بەڕاستی الله لەقورئاندا دووجار لۆمەی مەی کردووە وە لەجاری سێهەمدا حەرامی کردووە، منیش ئەترسم لەوەی خەڵکی بەیەکجاری پابەند بکەم بەحەقەوە کەچی وازبێنن لەو حەقە، ئینجا دەبێتە فیتنە).([21])

## ئامۆژگاری -26-

قەدری خەڵکی بگرن وجۆرەکانیان بناسن، وە ئەو پیاوانە پێشبخەن کە:

أ- لەئەهلی علم وفەزڵن؛ دەقەکان لەگەورەیی ئەمانەدا زۆرن.

---

٢١ خاوەنی کیتابی (العقد الفرية) باسی کردووە.

ب- بەتەمەنەکان: چونکە (لەئێمە نییە ئەوکەسەی ڕێزنەگرێ لەگەورەکانمان، وسۆز وبەزەیی نەبێ بۆ بچوکەکانمان، وە حەقی زاناکانمان نەزانێت).[22]

ج- لەخانەوادەیەکی بەڕێز وقسەڕۆ؛ لەسەرووی هەمووشیانەوە خانەوادەی پێغەمبەر ﷺ.

## ئامۆژگاری -27-

بگەڕێ بەناو خانەوادەی شەهیدان ودیلەکان وە بییانخە پێش کەسانی دیکەوە، وە سەردانی نەخۆش بکە.

وە لەگەڵ براکانت ببە وەکو خزمەتکارێک بۆیان؛ چونکە لەڕاستیدا تۆ تەنها پیاوێکی لەئەوان جگە لەوەی باری تۆ لەباری هەموویان قورسترە، وە لەهەموویان زیاتر لێپرسینەوەت لەگەڵدا ئەکرێ لەلای الله؛ کەواتە کاربکە بۆ سبەی.

## ئامۆژگاری -28-

بەچاکی پەیامنێرەکەت هەڵبژێرە وبینێرە بۆلای هۆزە عەشایەرەکان

٢٢ ئەحمەد گێڕاویەتیەوە لەگەڵ ترمذی و حاکم وتەبەڕانی، وە مونذیری و هەیثەمی دەڵێن: سەنەدەکەی چاکە، وە ترمذی دەڵێت: نامۆیە، وە شوعەیب ئەرنەئوت دەڵێت: چاکە بەهۆی فەرمودەی تر، بەڵام بێ وتەی (حەقی زاناکانمان نەزانێت).

وگرووپە چەکدارەکان، بەهەمان شێوە ئەوانەش هەڵبژێرە کە بەرپرسن لە (بازگە وپشکنینەکان) ولێپرسینەوەی خەڵکی؛ چونکە ئەوان ڕوخساری دەولە دەردەخەن بۆ خەڵکی، ئەگەر چاکەکاربن خەڵکیش چاک ئەبن، وئەگەر خراپەکاربن ئێمە خراپ دەبین، بەگشتی: (دانایەک بنێرە وئامۆژگاری مەکە).

## ئامۆژگاری -29-

ئەی فەرماندە ووریابە لەدەمارگیری جاهیلیەت؛ چونکە بەڕاستی موڵکی بناغە دامەزراو نارۆخێ بەبێ دەمارگیری زیادەڕەوانە، وە زیری وفروفێڵ بەکاربهێنە بۆ هەڵوەشاندنەوەی نەک تەنها هێز؛ چونکە بەڕاستی خەڵکی عێراق خروجیان کردە سەر عەبدولمەلیک کوڕی مەڕوان لەگەڵ ئیبن ئەشعەث وتێیاندابوو کۆمەڵێ لەچاکترین شوێنکەوتەکان، وەکو سەعید کوڕی جوبەیر وهاوشێوەکانی، ئینجا حەجاج شکستی پێیان هێنا لە (دێرولجەماجم) ([23]) بەفروفێڵ زیاتر لەبەکارهێنانی هێز، وە بزانە یەکێک لەسیاسەتی دانایی پەلەکردنە لەلێسەندنەوە لەدەستی ئەوانە، بەتایبەت سەرکردەکانیان.

---

٢٣ جەنگی (دەیر ولجەماجم) جەنگی جیاکەرەوە بوو لەنێوان حەجاج کوڕی یوسفی ثەقەفی و عبدالرحمن کوڕی ئەشعەث، وە کۆتاي هات لەبەرژەوەندی حەجاج، وە دێر جەماجم لە پشتی کوفەوەیە بەدوری حەوت فەرسەخ لێیەوە.

## ئامۆژگاری -30-

دەستبگرن بەڕاستی وئیجتیهاد ووره بەرزییەوە، وە دووربن لە دەستەوەستان؛ چونکە ئەوە -سوێند بە الله- زەلیلترین کاروانە، وەهەرچەندە نەتتوانی دووبارە هەوڵ بدەرەوە، چونکە بەهۆی تاقیکردنەوەوە زانراوە کە هەر کردەوەیەک الله ئاسانکاری دەکات ئەوە کۆسپەکان یەك لەدوای یەك.

## ئامۆژگاری -1-

دڵسۆزی بۆ الله گوفتار وکردار؛ چونکە الله هیچ کردەوەیەک قبوڵ ناکات جگە لەو کردەوانەی کە دروست ودڵسۆزن، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (لەڕاستیدا کردەوەکان بەپێی نیازەکانە، وبەڕاستی هەموو مرۆڤێک نیازەکەی بۆ ئەمێنێتەوە)([24])، هەروەها ئەفەرمووێت: (سوێند بەو زاتەی گیانی منی بەدەستەوەیە هەر برینێک کە برینداربووە لەپێناو الله ئیلا لەڕۆژی دواییدا دێت وبەو شێوەیەی کە برینداربوو؛ ڕەنگەکەی ڕەنگی خوێنە وبۆنەکەی میسکە)([25]).

لەوەشدا بردنەوەی هەردوو دونیایە؛ پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (الله بووەتە کەفیلی هەرکەسێ کە جیهادی کردبێ لەپێناویدا، کە هیچ دەری نەهێناوە جگە لە جیهاد لەپێناو الله و بەڕاستدانانی ووشەکانی الله؛ بەوەی ئەیخاتە بەهەشتەوە یان ئەیگەڕێنێتەوە بۆ ماڵەکەی خۆی کە لێوەی دەرچووبوو لەگەڵ هەرچی بەدەستهێناوە لە پاداشت یان غەنیمەت)([26]).

ومەبەستتان لەجیهادەکەتاندا بەرزکردنەوەی ووشەی الله بێت

---

٢٤ متفق علیه

٢٥ موسلیم گێڕاویەتیەوە

٢٦ متفق علیە.

تاكو بەرزترین ئاست؛ لە ئەبو موسای ئەشعەرییەوە دەڵێت: پرسیاركرا لەپێغەمبەر ﷺ دەربارەی پیاوێک كوشتار دەكات بۆ ئازایەتی، یان كوشتار دەكات بۆ دەمارگیری، یان كوشتار دەكات بۆ ڕیابازی، كام لەوانە لەپێناو الله یە؟ پێغەمبەر ﷺ فەرمووی: (هەركەسێ كوشتار بكات بۆئەوەی ووشەی الله بكاتە بەرزترین ئاست ئەوا لەپێناو (الله)یە) ([27]).

## ئامۆژگاری -2-

لەخاوەن زانستەكان بپرسن هەرشتێ پێویستتان دەبێت لەهەمووشتێک كە لەفەرزەتی جیهاد لەپێناو الله دێتە پێشتان؛ چونكە بەڕاستی كۆدەنگ وەرگیراوە لەسەرئەوەی كە زانین لەپێش كردارە، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموویت: (داواكردنی زانست فەرزە لەسەر هەموو موسڵمانێک) ([28])، كەواتە مەكوژە وغەنیمەت بەدەستمەهێنە هەتا نەزانی بۆچی وادەكەی؟ كەمترین ئاستیش لەمەدا ئەوەیە كە كەسێک فەتوات بۆ بدات كە متمانەی پێ بكەیت لەسەر زانست ودینەكەی.

---

٢٧ متفق علیە

٢٨ ئیبن ماجە لە سونەنەكەی هێناویەتی وە ئیبن عبدالبر لە كتابی (جامع العلم)، وە هەندێك بەلاوازیان داناوە وەك ئەحمەد وبەیهەقی، وە موزی هێناویەتی بە پلەیەكی چاك، وە سیوتی دەڵێت كە صەحیحە، بگەڕێوە بۆ: (المقاصد الحسنة للسخاوي) وە (الدرر المنتثرة)ی سیوتی.

## ئامۆژگاری -3-

وریابە لەوەی لەسەرختنی الله دا خزم وکەسوکارە نزیک وخۆشەویستەکانت بخەیتە پێشەوە، هەرچەندە ئێمە دەزانین ئەم کارە سەختە لەسەر نەفست، بەڵام فەرموودەی الله تعالی یادبکەوە: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آَمَنُوا لَا تَتَّخِذُوا عَدُوِّي وَعَدُوَّكُمْ أَوْلِيَاءَ تُلْقُونَ إِلَيْهِمْ بِالْمَوَدَّةِ وَقَدْ كَفَرُوا بِمَا جَاءَكُمْ مِنَ الْحَقِّ} [الممتحنة: 1]، واتا: (ئەی ئەو کەسانەی باوەڕتان هێناوە دوژمنانی من و دوژمنانی خۆتان مەکەنە دۆستی گیانی بەگیانی، لەکاتێکدا خۆشەویستی و سۆزی خۆتانیان بۆ دەردەبرن، بەڕاستی ئەوان بێ باوەڕیش بوون بەوەی لە لایەن الله بۆتان هاتووە). چونکە بەڕاستی مافی الله واجبترە وە سەرخستنی دینی الله پێویستترە.

## ئامۆژگاری -4-

سوێند بە الله من تۆم خۆشدەوێ وە ئەوەشم خۆشدەوێ کە ڕزگارت دەکات؛ کەواتە ئامۆژگارییەکەم ببیستە دەربارەی بابەتێکی گرنگ، بابەتی "تەکفیر". پێغەمبەر ﷺ ئەفەرموێت: (هەرکەسێ شتێ بەئیماندارێک بڵێ کە تێیدا نەبێ ئەوا الله ئەیخاتە ناو کێم وزوخاوی دۆزەخیەوە هەتاکو لەو قسەیەی دەردەچێت) ([29])؛ دەسا

٢٩ ئەحمەد وئەبو داوود و حاکم وتەبەڕانی گێڕاویانەتەوە، وە حاکم دەڵێت: ئیسنادەکەی صەحیحە وە زەهەبیش بەهەمان شێوە، وە

ئەی براکەم بزانە کە ناولێنان و حوکمی کوفر مافی الله تعالی یە[30]، دروست نییە بچەسپێندرێتە سەر هیچ کەسێ ئیلا بەسەر ئەوانەی کە بەشەرع کافرە، وەهەروەها ئەویش کۆمەڵێ مەرج وبەربەستی هەیە، وە ڕەنگە ووتەی کوفر یان کردەوەی کوفر لەمرۆڤێکەوە دەرچێ کەچی کافر نەبێتەوە بەهۆی هەبوونی بەربەستێک لە بەربەستەکانی تەکفیرکردن، وەهەرکەسێ موسڵمانبوونەکەی بەیەقینەوە بسەلمێندرێ، ئەوا لێوەی دەرناچێ ئیلا بەیەقین؛ دەسا وریابە لە گومان، بەڵکو لەسەر ڕوونکردنەوە ببە دەربارەی هەرشتێ کە خیلافی خاوەن زانستە کارگوزارەکانی تێ کەوتووە.

## ئامۆژگاری -5-

وەفاداری لە پەیمان وئەمانی ڕاست ودروست بەپێی شەرع، زۆر زۆر ووریابە لە ڕازێندراوەکانی شەیطان، الله تعالی ئەفەرمووێت: {فَمَنْ

مونذیری دەڵێت: سەنەدەکەی باشە. هی شوعەیب ئەڕنەئوت دەڵێت: سەنەدەکەی صەحیحە.

٣٠ ئیبن تەیمیە لە ڕەتدانەوەی بەکری دەڵێت: (ئەوەی درۆی بۆ هەڵبەستای وزینای کرد لەگەڵ خانەوادەکەت، بۆت نیە درۆی بۆ هەڵبەستی و زینا لەگەڵ خانەوادەکەی بکەی؛ چونکە درۆ و زینا حەڕامە لە حەقی الله تعالی، بەهەمان شێوە تەکفیریش حەقی پەروەردگارە جا کەس تەکفیر مەکە جگە لەوەی الله وڕەسولەکەی تەکفیریان کردوە)، وە لەمجموع فتاوا دەڵێت: (بابەتی کافرکردن وبەفاسیق دانان لە بابەتی ناو و حوکمەکانە (الأسماء والأحکام).

نَكَثَ فَإِنَّمَا يَنْكُثُ عَلَى نَفْسِهِ} [الفتح: 10]، واتا: (جا ئەوەی پەیمانەکە بشکێنێت و لێی پاشگەز ببێتەوە، ئەوەلەسەر خۆی دەکەوێت)، هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: (موسڵمانان خوێنیان یەکسانە، نزمترینەکەیان بەگەردنیانەوە ئاڵاوە، وە بەرزترینەکەیان پاداشتی لەوان زۆرتر دەبێ، وە ئەوان دەستێکن بەڕووی دوژمنەکانیان، خۆڕاگرتووەکەیان وەڵامی لاوازبووەکەیان دەداتەوە، هەروەها ڕۆشتووەکەیان وەڵامی دانیشتووەکەیان دەداتەوە)([31]).

وەچاک بزانە کە ئێمە ڕێگەمان نەداوە بەهیچ کەسێ لەسەربازەکانمان کە پەیمان ببەستێ یان ئەمان بسەنێتەوە، بەڵکو ئەوە مافی ئەمیری ئیماندارانە یان جێگرەکانی، هەربۆیە تێڕوانینی ئەو -زۆرجار- گشتگیرە وزاناترە بەبەرژەوەندییەکانی دەوڵەت.

## ئامۆژگاری -6-

ئیجتیهادبکەن لەبەندایەتی وطاعەت، و وریابە لەئەنجامی خراپی سەرپێچی کردن وشەڕی نەفسی خۆت وشەیطان، چونکە

31 ئەحمەد وئەبو داوود و نەسائی گێڕاویانەتەوە، وە حاکم دەڵێت: صەحیحە لەسەر مەرجی هەردوو شێخەکە، وە شوعەیب ئەرنەئوت دەڵێت: بەفەرمودەی تر ئەوە صەحیحە.

فاروق عومەری کوڕی خەطاب ئامۆژگاری سەعەدی کوڕی ئەبو وەقاص کرد (الله تعالی لێیان ڕازیبێت): (...لەڕاستیدا من فەرمان بەتۆ وسەربازەکانیشت دەکەم کە لەگەڵتن بەوەی تەقوای الله بکەن، هەروەها فەرمان بەتۆ وسەربازەکانت دەکەم کە ووریای سەرپێچی وتاوانەکانتان بن لەدوژمنەکانتان زیاتر؛ چونکە بەڕاستی تاوانی سووپا ترسناکترە لەسەریان لەدوژمنەکانیان، وە داوای یارمەتی لە الله بکەن بۆخۆتان هەروەک داوای سەرکەوتنی لێ ئەکەن بەسەر دوژمنتان) ([32]).

## ئامۆژگاری -7-

نوێژەکان نوێژەکان ئەی سەربازانی الله، چونکە ئەوە دڵەکان بەهێز دەکات وئەندامەکان چالاک دەکات وڕێگری دەکات لە بێئابڕویی وخراپەکاری، هەروەها نوێژ شوێنی پەرستنی پەروەردگار وداواکردنی سەرخستنە، وە نزیکترین کات کە بەندە لەپەروەردگاریەوە نزیکە بریتیە لەوکاتەی کە لە سوجدەدایە، کەواتە نوێژ ئەستوونی دین ودرووشمی موسڵمانانە، کەواتە دووای مەخە ئیلا بەهۆی عوزرێکەوە کە الله ڕاستییەکەی دەزانێت ئایا ڕاستە یان نا.

٣٢ وە لە کتابی (العقد الفرید) هاتووە، وە لە (بدائع السللك)، وە لە (نهایة الأرب).

## ئامۆژگاری -8-

دووربن لـە لەخۆبایی بـوون وخۆشـەویستی خۆدەرخستن، بەتایبـەت لەپاش سـەركەوتن بەسـەر دوژمن؛ چونكە ئەوە یەكێكە لەچاكترین هەڵی شـەیطان، بۆئەوەی بەرهەمی جیهادەكەتان ودووورودرێژی سـەنگەرنشـینەكەتان بەفیـڕۆ بـدات لەدونیـا ودوواڕۆژ.

## ئامۆژگاری -9-

دوو هۆكار سـەرەنجامەكەی تیاچوون وشكستهێنانە:
1- دەسـتدرێژی: اللـه تعالی ئەفەرمووێت: {يَا أَيُّهَا النَّاسُ إِنَّمَا بَغْيُكُمْ عَلَى أَنْفُسِكُمْ} [يونس: 23]، كەواتـە سـەركەوتن لەگەڵ دەسـتدرێژی نییـە.
2- گزی كـردن: اللـه تعالی ئەفەرمووێت {وَلَا يَحِيقُ الْمَكْرُ السَّيِّئُ إِلَّا بِأَهْلِهِ} [فاطر: 43]؛ كەواتـە هاوڕێیەتی مەكەن لەگەڵ گزیكـردن.

## ئامۆژگاری -10-

دڵی خـۆت بشـكێنە لەكاتی ئارەزوو،چونكـە هەرشـتێ ئارەزووی بكـەی نابێ داوای بكـەیت: {إِنَّ النَّفْسَ لَأَمَّارَةٌ بِالسُّوءِ} [يوسف: 53]، وە خووبگـرە بـە ڕۆژووگرتـن تاكـو پاكداوێنی بەدەسـت بهێنیت، وبەگشـتی: (ئارەزووت بگـرە، وبەخیل ببـە لەگـەڵ نەفسـت لەسـەر هەرشـتێ كـە بـۆت حەڵاڵ نییـە؛ چونكـە بەڕاسـتی بەخیلی لەگـەڵ

نەفسی خۆت ئینصافی تێدایە لەهەرشتێ نەفست حەزی لێ بکات یان پێی ناخۆشبێ).

## ئامۆژگاری -11-

ڕاستگۆبە لەسەر الله لەسەر هەر کارێ پێت بسپێردرێ وخۆت ماندوو مەکە لەشتێکدا پێت نەسپێردرابێ؛ چونکە الله پرسیاری ئەوەت لێ ناکات، بەڵکو لەهەموو کارەکانتدا ڕاستگۆبە؛ چونکە بەڕاستی ڕاستگۆیی ڕزگارکەرە ودرۆ لەناوبەرە، و(بەسە بۆ مرۆڤ تاوانباربێت بەوەی هەرشتێکی بیست بیگێڕێتەوە وباسی بکات) ([33]).

## ئامۆژگاری -12-

بۆ براکانت ڕازیبە لەسەر هەرشتێ کە بەهۆیەوە لە الله نزیکت ئەکاتەوە ولەسەرپێچی فەرمانەکانی دوورت ئەکاتەوە، وزۆر زەردەخەنە بکە بەڕوویاندا، وگوێبگرە لەهەرکەسێ کە لەخۆت گەورەترە، وئەگەر بینییانت کاردەکەن ئەوا تۆش کاریان لەگەڵ بکە؛ چونکە دانیشتنت دڵەکان تەنگ ئەکات، وئەگەر براکەت سەرفرازبوو پیرۆزبایی لێ بکە، وە بزانە کە: «خێرایی لۆمەکردن دادپەروەری نییە».

---

٣٣ () موسلیم گێڕاویەتیەوە لە پێشەکی صەحیحەکەیدا، وە ئیبن حەجەر لە فەتح بە صەحیحی داناوە.

## ئامۆژگاری -13-

بەشوێن کەموکورتییەکانی خەڵکی مەڕۆ، بەتایبەت فەرماندەکەت وبراکانت دەسا کەموکورتییەکانیان داپۆشە بەپێی توانای خۆت تاکو الله کەموکورتیەکانت داپۆشێ، وەهەوڵ مەدە ئەوەی لێت دوورە ئاشکرای بکەی، پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: «دووربن لە گومان؛ چونکە گومان درۆترین ووتەیە، وگومان مەبەن وسیخوڕی مەکەن وئیرەیی مەبەن ویەکتر پشتگوێ مەخەن وڕق وکینە هەڵمەگرن وبەبرایەتییەوە ببن بە بەندەی الله»[34].

هەروەها هاتووە لە مالیکەوە کە دەڵێت: (لە مەدینەدا گەلێکم بینی کە هیچ کەموکورتیەکیان نەبوو کەچی بەشوێن کەموکورتی خەڵکی ئەگەڕان ئینجا خەڵکیش کەموکورتی ئەوانیان باس دەکرد، هەروەها گەلێکی دیکەم بینی کە کەموکورتییان هەبوو بەڵام بێدەنگ دەبوون لەئاستی کەموکورتی خەڵکی ئینجا خەڵکیش بێدەنگ ئەبوون لەئاستی کەموکورتیەکانی ئەوان) [35].

---

٣٤ () متفق علیه

٣٥ () باجی لە ڕاڤەی پەرتوکی (الموطأ) هێناویەتی، وە ئەبو شەیخ ئیبن حەبان لە پەرتوکی (النکت والنوادر)، وە جورجانی هێناویەتی لە تاریخەکەی لە غەیری مالیکیش.

## ئامۆژگاری -14-

چاک بزانن ئەی سەربازانی الله کە ئێمە وئێوەش دڵخۆشین بەدامەزراندن وپاراستنی دەوڵەتی ئیسلام لەسەر خاکی ڕافیدەین، بەڵام چاک بزانن کە ئەمە دەوڵەتی (هارۆونی ڕەشید) نییە بۆئەوەی هەرچۆنمان بووێ قسەبکەین لەگەڵ پەڵە هەورەکانی ئاسمان وەکو ئەوکات، بەڵکو ئەمە دەوڵەتی لاوازەکانە؛ لەدوژمن ئەترسێین وئەیانتۆقێنین، هەروەک هاوەڵەکان لەکاتی دەوڵەتی ئیسلامی یەکەم لەشاری مەدینە کە چەکیان دانەدەنا لەبەر ترس، وە ڕەنگە جولەکەیەک دزەی بکردایە هەتا ئەسوڕایەوە بەدەوری قەڵایەک کە ئافرەت ومنداڵی تێدابوو کە هیچی نەدەدۆزییەوە تاکو بیکوژێ جگە لە ئافرەت.

لەبەرئەوە نەرم ونییان بن لەگەڵ خەڵکی وهەستی خۆشی ئیسلام وسەرفرازیەکەی بخەنە دڵیانەوە، نەک هەستی ترسان لەئیسلام وحوکمەکانی بخەنە دڵیانەوە، هەرچەندە ئەگەر بەهاکەی تاڵیش بێت لەسەر ئەهلەکەمان بێت،

دەسا فێریان بکەن بە ووتە وکردەوەی جوان وباش تاکو خەڵکی تاڵیەکەی قبوڵ ئەکات، وبەگشتی: دینەکەیان وحوکمەکانی ودەوڵەتی ئیسلام خۆشەویست بکەنەوە لەدڵی خەڵکی؛ چونکە چاکترین بەندەکانی الله (ئەوانەن کە بەندەکانی الله خۆشەویست ئەکەنەوە لەلای الله، وە الله خۆشەویست ئەکەنەوە لەلای

بەندەکانی، هەرئەوانیش بەسەر زەویدا دەڕۆن ئامۆژگاری دەکەن) ([36]).

## ئامۆژگاری -15-

صاحبی کوڕی عەبباد([37]) دەڵێت: (ڕێزلێنان لە کەسایەتی دەسەڵاتدار بەدڵنیاییەوە فەڕزە، وبێگومان پێویستە لەسەر هەرکەسێ دەنگ ببیستێ لەکاتێکدا ئەبینێت) ([38])، کەواتە هەستی ڕێزلێنانی ئەمیری ئیماندارا‌ن لەناخی خۆت دروست بکە؛ چونکە (یەکێک لەنیشانەکانی بەگەورەدانانی الله ڕێزلێنانی بەساڵاچووەکان... وڕێزلێنانی خاوەن دەسەڵاتێکی دادپەروەرە) ([39])، وە گوێڕایەڵی دەسەڵاتدار لەهەموو شتێ جگە لە سەرپێچی

---

٣٦ فەرمودەیەکی مەرفوعە بەیەقی گێڕاویەتیەوە بە سەنەدێکی لاوازەوە لە (شعب الإيمان).

٣٧ زەهەبی لە پەرتوکی (سير أعلام البلاء) دەڵێت: (وەزیری گەورە زانای خاوەن.. ڕۆشنبیری نوسەر... وە بەڕاستی ڕەوانبێژ بووە)، وە لەپەرتوکی (ميزان الاعتدال): (ئەدیبێکی زیرەکی شیعەی موعتەزیلەیە... وە هۆنراوە وشیعرەکانی زۆر چاکن وە بە نمونە بەشیعرەکانی دەهێنرێتەوە)؛ لەبەر ئەوە ئاماژە دەکرێت ونمونە دەهێنرێتەوە بە شاعیرەکان وڕەوانبێژەکان لەگەڵ ئەوەش کە لادانیان هەیە لە عەقیدە.

٣٨ وەری گرتووە لە (بدائع السلك في طبائع الملك).

٣٩ ئەبو داوود و بەیەقی وئیبن ئەبی شەیبە، وبوخاری لە (الأدب المفرد) هێناویانە، وە سەنەدەکەی چاکە (رياض الصالحين)ی پەرتوکی نەوەوی.

وتاوان واجبە ئەگەر دادپەروەر بێ یان ستەمکار، ووریابن لەوەی بەناهەق تانەی لێ بدەن؛ ڕەنگە یەکێك بێت لەتاوانە گەورەکان کە بەندە لەناو ئەبات، وە یەکێک لە ئامۆژگاریەکانی ئەکثەمی کوڕی صەیفی([40]): (خیلاف کەم بکەنەوە لەسەر ئەمیرەکانتان... چونکە جەماعەت بوونی نییە بۆ کەسێک خیلافی لەسەربێت) ([41]).

## ئامۆژگاری -16-

سەلامە لە ئەمیرەکەت بکە، و ملکەچبە بۆ بیروڕا ونەخشەکانی، بۆئەوەی ووشە بەش بەش نەبێت وڕیزەکەمان کەرت کەرت نەبێ، هەتا ئەوکاتەی کارەکە بیروڕایەک یان بابەتێکی ئیجتیهادی بێت، یان ڕوویەکی دیکەی هەبێت لەشەریعەت نەک خۆی لەخۆیدا سەرپێچی بێت، ومادەم تۆش داوای پاداشت ئەکەی ئەوا پاداشت لەگوێگرتن وگوێڕایەڵیدایە هەتا ئەوکاتەی پێچەوانەی شەریعەت نەبێت.

هیچ بابەتێک لەئەمیرەکەت مەشارەوە کە هەست دەکەی لەباسکردنیدا بەرژەوەندییەکی شەرعی هەیە بۆنموونە گەندەڵی

٤٠ دانایەکی بەناوبانگی عەڕەبە، جیاوازی هەیە لەوەی ئیسلام بووە یان نا، وە چاوی نەکەوتووە بە پێغەمبەر صلی الله لەگەڵ ئەوەی لەسەردەمی ئەودا ژیاوە، وە ئیبن عبدالبر دەگێڕێتەوە کە موسڵمان نەبووە.

٤١ ئەبو شەیخ دەریهێناوە لە پەرتوکی (أمثال الحدیث)، وە ئیبن قوتەیبە هێناویەتی لە (عیون الأخبار).

بەگشتی: کە لەڕاستیدا هەواڵ لێدانی بریتیە لەئامۆژگاری وشاردنەوەی بریتیە لەگزیکردن وغەشکردن، وئەمەش غەیبەتکردنی حەڕامکراو یان نەمیمەتی زەمکراو نییە بەمەرجێک ئەوەی کە بەرزیدەکەیتەوە بە یەقین ودڵنیاییەوە سەلمێندرابێت لەلای خۆت یان زۆربەی گومانت بۆ ئەوە بڕوات، نەوەوی دەڵێت: (ئەگەر هاتوو پێویست بوو ئەوا هیچ ڕێگریەکی تێدا نییە؛ ئەمەش هەروەک ئەوەیە کە.... هەواڵ بداتە پێشەوا، یان هەرکەسێ کاربەدەست بێت بەوەی کە مرۆڤێک ئەوما دەکات، کە هەوڵی خراپکاری وگەندەڵی دەدات، وپێویستە لەسەر خاوەن دەسەڵات ئەوە ئاشکرابکات ولایببات؛ هەربۆیە هەموو ئەمانە وهاوشێوەکانی حەرام نیین، بەڵکو ڕەنگە هەندێجار واجب بێت، وهەندێکی سونەت بێت بەپێی شوێن وکاتەکەی) ([42]).

ووریابە لەوەی کەسێکی خیانەتکار یان خیانەتکار بپارێزیت؛ پێشتر ئەوترا: (بەس بێت مرۆڤ خیانەتکاربێ بەوەی خیانەتکاران بپارێزێت) ([43])، الله تعالى ئەفەرموویت: {وَإِذَا جَاءهُمْ أَمْرٌ مِّنَ الأَمْنِ أَوِ الْخَوْفِ أَذَاعُواْ بِهِ وَلَوْ رَدُّوهُ إِلَى الرَّسُولِ وَإِلَى أُوْلِي الأَمْرِ مِنْهُمْ لَعَلِمَهُ الَّذِينَ يَسْتَنبِطُونَهُ مِنْهُمْ وَلَوْلاَ فَضْلُ اللّهِ عَلَيْكُمْ وَرَحْمَتُهُ لاَتَّبَعْتُمُ الشَّيْطَانَ إِلاَّ قَلِيلاً} [النساء: 83].

---

٤٢ لە شەرحی نەوەوی هەیە لەسەر (صحيح مسلم).

٤٣ ئەحمەد هێناویەتی لە پەرتوکی زوهد، وە بەیهەقی لە (شعب الإيمان) هێناویەتی لە مالیکی کوڕی دینارەوە.

## ئامۆژگاری -17-

ئارامبگرە لەسەر ئەمیرەکەت هەرچەندە ستەمکاربێت؛ چونکە لەڕاستیدا ئەمە یەکێکە لە فەڕیزەتەکانی دین؛ پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: (هەرکەسێ شتێکی لەئەمیرەکەی بینی کە پێی ناخۆش بوو ئەوا با ئارامبگرێ لەسەری) ([44]).

عبداللە کوڕی عومەر هەمان شتی باسکردووە بۆ عبداللە کوڕی موطیع کوڕی ئەسوەد کاتێک دەستبەرداری گوێڕایەڵی ئەمیری کاتی خۆیان بوون واتە (یەزید)، سەرەڕای ئەوەی ستەمکاری هەبووە، لەسەحیحی موسلمدا هاتووە: عبداللە کوڕی عومەر هاتەلای عبداللە کوڕی موطیع کاتێک بارودۆخی حەڕرە ڕوویدا لەکاتی سەردەمی یەزیدی کوڕی معاویە وپێی گووت: (بالیفێک بۆ ئەبو عەبدولڕەحمان ڕاخەن)، پێی گووت: من نەهاتوومەتە لای تۆ بۆئەوەی دانیشم، بەڵکو هاتوومەتە لای تۆ بۆئەوەی فەرموودەیەکی پێغەمبەرت ﷺ بۆ باسبکەم کە بیستوومە فەرموویەتی: (هەرکەسێ دەستێکی گوێڕایەڵی بکشێنێتەوە ئەوا لەڕۆژی دوواییدا ئەگاتەوە بە دیداری اللە وهیچ بیانوویەکی نییە، وهەرکەسێ بمرێت وهیچ بەیعەتێک لەگەردنیدا نەبێت ئەوا بەشێوازێکی جاهیلیەت مردووە) ([45]).

---

٤٤ متفق علیه.

٤٥ بگەڕێوە: (مجموع الفتاوى)ی ئیبن تەیمیە.

هەروەها شێخ موحەممەدی کوڕی عەبدولوەهاب دەڵێت: (وایدەبینم جیهاد بەردەوامە لەگەڵ هەموو پێشەوایەک؛ چاکەکاربێت یان خراپکار... وە وایدەبینم گوێگرتن وگوێڕایەڵی پێشەوایانی موسڵمانان واجبە؛ چاکەکار وخراپەکاریان هەتا ئەوکاتەی فەرمان نەکەن بەتاوان وسەرپێچی الله تعالی) ([46]).

**ئامۆژگاری -18-**

لەهەرشوێنێک بن لەسەر خاکی جیهاد دەستبگرن بەپاسەوانیکردنی شەوان، وحەلاڵی ناکەم بۆ سێ کەس بخەون، لەکاتێکدا نە ئەمیر ونە پاسەوانیان نەبێت، هەروەها یەکێک لە وەسێتەکانی ئەبوبەکر ﵁ بۆ یەکێک لە سەرکردەکان: (خۆت بپارێزە لەشوێنی مانەوە وخەوتن؛ چونکە عەرەب غەفڵەتیان تێدایە) ([47]).

**ئامۆژگاری -19-**

خۆئامادەکردن خۆئامادەکردن ئەی موسڵمان؛ چونکە الله تعالی فەرموویەتی: {وَأَعِدُّوا لَهُمْ مَا اسْتَطَعْتُمْ مِنْ قُوَّةٍ وَمِنْ رِبَاطِ الْخَيْلِ} [الأنفال: 60]، وە یەکێک لە خۆئامادەکردن ڕاهێنانە وەرزشیەکانە کە هێزی جەستەیی وچالاکییە جەنگییەکان بۆ خاوەنەکەی دابین

---

٤٦ باسی کردووە لەپەرتوکەکەی (الکبائر)، و (اصول الإیمان).

٤٧ هندی هێناویەتی لە پەرتوکی (کنز العمال)ی دەینەوەری، وە ئیبن عەساکیر هێناویەتی لە پەرتوکی تاریخەکەی.

دەکات، ووتراوە: (هەرشتێ داوای بکەی لەکاتی پێویستی پێی ئەوا کاتی بەسەرچووە، کەواتە خۆت ئامادەبکە بۆ سبەی پێش ئەوەی بچیتە ناو سبەییەوە).

## ئامۆژگاری -20-

سەنگەرنشینی سەنگەرنشینی؛ واتە خۆت ببەستەوە بۆ جیهاد لەپێناو الله؛ بۆ پاراستنی کەلێنەکان وزۆرکردنی کۆمەڵی موجاهیدان وترساندنی دوژمن، هەرچەندە ئەگەر درێژەش بخایەنێ لەوەدا؛ جا هەرکاتێ لەشوێنێک بوویت کە دوژمن بترسێنی ولێت بترسێ، ئەوا سەنگەرنشینیە؛ اللە تعالی ئەفەرمووێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اصْبِرُوا وَصَابِرُوا وَرَابِطُوا وَاتَّقُوا اللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ} [آل عمران: 200]، هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: (سەنگەرنشینی ڕۆژێک لەپێناو اللە چاکترە لەدونیا وئەوەش کە لەسەریەتی) ([48]).

## ئامۆژگاری -21-

براکەم ئاواتەخوازی دیداری دوژمن مەبە -ئەگەر ئاوات خوازییەکەت بەهۆی لەخۆڕازیبوون وشانازی وپشت بەخۆبەستن یان لەم جۆرانە بێت ئەوا-پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: (ئاواتەخوازی دیداری دوژمن مەبن، وداوای عافیەت لە اللە بکەن، بەڵام ئەگەر

---

٤٨ بوخاری.

بەدوژمن گەیشتن ئەوا ئارامبگرن، وە بزانن کە بەهەشت لەژێر سێبەری شمشێرەکانە) ([49]).

ودەستبگرە بەنزاکردن لەکاتی بەیەکگەیشتنی هەردوو ڕیزەکان؛ چونکە گیرا ئەبێت، لەڕۆژی ئەحزاب پێغەمبەر ﷺ نزایکرد: «پەروەردگارم ئەی دابەزێنەری کیتاب ومێنەری پەڵە هەورەکان وئەی شکێنەری ئەحزاب بیانشکێنە وسەرمان بخە بەسەریانەوە) ([50])، هەروەها لەنزاکانی: (پەروەردگارم تۆ هێز وسەرخەری منی، بەهێزی تۆ نەخشە ئەکێشم، وبەهێزی تۆ هێرش ئەکەم، وبەهێزی تۆ کوشتار ئەکەم)([51]).

## ئامۆژگاری -22-

دڵەکانتان ئازا بکەن؛ چونکە ئەوە یەکێکە لەهۆکارەکانی سەرکەوتن وسەرفرازی، وبزانە بەهێزترین باری ڕاهێنان بۆسەربازانی الله دوبارەکردنەوەی کوشتار وزۆرکردنیەتی، وزۆرتر باسی ڕق وکینە لەدژی دوژمن بکەن؛ لەبەرئەوەی ئەبێتە مایەی پێشڕەویکردن؛ بیری خۆتان بهێننەوە کە دوژمن دەستی درێژکردووە بەسەر دایکان وخوشکانتان، وڕێگای جومعە وجەماعەتی لێ گرتوون

٤٩ متفق علیه

٥٠ متفق علیه

٥١ هاتووە لە ئەبو داوود، وە ترمزی دەڵێت: فەرمودەیەکی چاکی نامۆیە.

وڕێی کشتوکاڵ وبازرگانی لێ گرتوون، وبەگشتی: (هیچی بۆتان نەهێشتووەتەوە لەخۆشییەکانی دونیا ودووارۆژ).

## ئامۆژگاری -23-

ئەگەر ڕۆشتن بۆ دوژمن ئەوا یارمەتی وەربگرن لە ڕێنیشاندەرەکان ئەگەر هاتوو نەتانتووانی خاکی خۆتان ودوژمنتان بەچاکی بپشکنن، وپێداویستی پێویست لەگەڵ خۆتان ببەن (چەک، وخواردن، وداو ودەرمان)، وجیامەبەرەوە لەوکەسەی هاوکاریت دەکات لەجیهادەکەت، ئینجا بجوڵێوە بەچەک ودەرزی وداو وچراکەت، وبەشی پێویستی فریاگوزاری برین وزام وکپکەرەوەی ئازار لە داو ودەرمان لەگەڵ خۆت هەڵگرە، وجلوبەرگ سوک بکەرەوە.

## ئامۆژگاری -24-

(کارێکی چاکە بکە لەپێش دەرچوون بۆ غەزا؛ لەبەرئەوەی ئێوە کوشتاری خەڵکی دەکەن بەکردەوەکانتان) ([52])، وچاکترین کردەوەش یەکبوونی ڕیز، وکۆکردنەوەی ووشەیە؛ الله تعالی ئەفەرمووێت: {إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الَّذِينَ يُقَاتِلُونَ فِي سَبِيلِهِ صَفًّا كَأَنَّهُمْ

٥٢ بوخاری بابێکی هێناوە: ((باب عمل الصالح قبل القتال)، وە ئەبو دەرداء دەڵێت: بەڵکو ئێوە بەکردارەکانتان جەنگ دەکەن) تا کۆتایی وە ڕستەی یەکەم ئەثەرێکە کە سەنەدەکەی دابڕاوە، وە دووەم سەنەدەکەی دروستە، ئیبن حەجەر باسی کردووە لە (فتح الباري).

بُنْيَانٌ مَرْصُوصٌ} [الصف: 4]، دووربن لە نیاز ونییەتی پێچەوانە؛ لەبەرئەوەی ئەگەر ووشە کۆببێتەوە ونیاز ونییەتەکان پێچەوانە ببنەوە ئەوا دەبێتە هۆکارێک بۆ جیاوازی نێوان موسڵمانان، وە بزانە کە مرۆڤ بە براکانیەوە وەستاوە، وەهەروەک لەپەندەکەدا ووتراوە: (لاواز ئەوکەسەیە کە دادەبەزێ بۆ جەنگ بەتەنها).

## ئامۆژگاری -25-

دوژمنێکتان نەتانترسێنێ؛ الله تعالى ئەفەرمووێت: {قَالَ رَجُلَانِ مِنَ الَّذِينَ يَخَافُونَ أَنْعَمَ اللَّهُ عَلَيْهِمَا ادْخُلُوا عَلَيْهِمُ الْبَابَ فَإِذَا دَخَلْتُمُوهُ فَإِنَّكُمْ غَالِبُونَ وَعَلَى اللَّهِ فَتَوَكَّلُوا إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ} [المائدة: 23].

وبزانن کە سەرکەوتن وجێنشین بوون بەدەستی الله ﷻ بەتەنها: {إِنْ يَنْصُرْكُمُ اللَّهُ فَلَا غَالِبَ لَكُمْ وَإِنْ يَخْذُلْكُمْ فَمَنْ ذَا الَّذِي يَنْصُرُكُمْ مِنْ بَعْدِهِ وَعَلَى اللَّهِ فَلْيَتَوَكَّلِ الْمُؤْمِنُونَ} [آل عمران: 160].

تەبەری لەتەفسیرەکەیدا دەڵێت: ((فَلَا غَالِبَ لَكُمْ) لە خەڵکی، دەفەرمووێ: ئەگەر سەرتان بخات ئەوا هەرگیز هیچ کەسێ زاڵ نابێ بەسەرتان، هەرچەندە ئەگەر سەرجەم ئەوانەی نێو جەمسەرەکانی زەوی لەبەدیهێنراوەکان بۆتان کۆببنەوە، کەواتە لەدوژمنانی الله مەترسن بەهۆی کەمی ژمارەتان وزۆری ژمارەیان هەتا ئەوکاتەی لەسەر فەرمانی الله بن وبەردەوام بن لەسەر گوێڕایەڵی الله وگوێڕایەڵی پێغەمبەرەکەی ﷺ؛

چونکە سەرەنجام زاڵبوون بۆ ئێوەیە وسەرکەوتن بۆ ئێوەیە بەسەریانەوە).

دەسا سەرخستنی الله داگرنە سەر خۆتان بە نزاکانتان، ومانای بۆ بەرن؛ چونکە بەندایەتی بە نزاکردن ئاسەواری سەرنجراکێشی هەیە بۆ سەرکەوتن، وڕاستکردنەوەی نیاز ونییەتەکان، الله تعالى ئەفەرمووێت: {أَمَّنْ يُجِيبُ الْمُضْطَرَّ إِذَا دَعَاهُ وَيَكْشِفُ السُّوءَ وَيَجْعَلُكُمْ خُلَفَاءَ الأَرْضِ أَإِلَهٌ مَعَ اللَّهِ قَلِيلاً مَا تَذَكَّرُونَ} [النمل: 62].

## ئامۆژگاری -26-

لوتکەی تێکۆشان بەکاربهێنن بۆ کوشتاری دوژمنی هێرشبەر، و دووربن لەترسنۆکی وبێتوانایی، چونکە ئەو دوو نەخۆشییە زۆر ترسناکن کە پێغەمبەر ﷺ پەنای لێ گرتووە، دەسا ئێوەش پەنای لێ بگرن، وبزانن کە پاداشت -هەروەکو بەندایەتییەکەمان- بەپێی ئاستی نارەحەتی وماندووبوونەکەیەتی؛ الله تعالى ئەفەرمووێت: {وَلاَ يَقْطَعُونَ وَادِياً إِلاَّ كُتِبَ لَهُمْ لِيَجْزِيَهُمُ اللّهُ أَحْسَنَ مَا كَانُواْ يَعْمَلُونَ} [التوبة: 121]، هەروەها پێغەمبەر ﷺ ئەفەرمووێت: (سووربە لەسەرئەوەی سوودبەخشە بۆت، وپشتببەستە بە الله وە سڵ مەکەوە) ([53]).

---

٥٣ موسلیم گێڕاویەتیەوە.

## ئامۆژگاری -27-

(ئەی ئەهلی ئیسلام! بەڕاستی ئارامگرتن سەربەرزییە، وسڵکردنەوە شکستهێنانە، وبەڕاستی سەرکەوتن لەگەڵ ئارامگرتنە) ([54])، وبەڕاستی ترسنۆکی کوژەرە و ئاگاداربوون بێ گومان دەبێ هەبێت، وئەوانەی کە لەجەنگدا ئەکوژرێن لەکاتی پشتهەڵکردن زۆر زیاترن لەوانەی کە ئەکوژرێن لەکاتێکدا پێشڕەون، لەپێشدا لەکاتی ئیسلامی یەکەمدا فەڕزکرا کە موسڵمان هەڵنەیات لەسەر دە کەس؛ ئای کە چەند پێویستمان بەو ڕۆژەیە، الله تعالی ئەفەرمووێت: {وَمَنْ يُوَلِّهِمْ يَوْمَئِذٍ دُبُرَهُ إِلَّا مُتَحَرِّفًا لِقِتَالٍ أَوْ مُتَحَيِّزًا إِلَى فِئَةٍ فَقَدْ بَاءَ بِغَضَبٍ مِنَ اللَّهِ وَمَأْوَاهُ جَهَنَّمُ وَبِئْسَ الْمَصِيرُ} [الأنفال: 16]، واتا: (هەرکەس لەو ڕۆژەدا ڕابکاتە دواوە و پشتیان تێبکات ئەوە بەڕاستی لەگەڵ خەشم و قینی الله گەڕاوەتەوە و سەرئەنجام جێ و ڕێگەی دۆزەخە کە ناخۆشترین جێگە و سەرئەنجامە مەگەر مەبەستی بەکارهێنانی هونەری جەنگ بێت یاخود مەبەستی شوێن گۆڕین و جێ گۆڕین و جێ گۆڕکێ بێت بۆ لای دەستەیەکی تر)، دەسا ئارامبگرە لەگەڵ ئەمیرەکەت وئارامی دڵی ئەویش بەرەوە لەجەنگ وکاتی بەیەکگەیشتنی هەردوولا، کەواتە ئارامکردنەوە یەکێکە لەپێویستییەکانی سەرکەوتن، سەرەنجامی ئارامگرتن سوپاسکراوە، وسەرەنجامی ئارامگرتنیش سەرکەوتنە، تەنها بەهیوا خواستن ناگەی بەئامانجەکانت.

---

٥٤ لە (عیون الأخبار) و(العقد الفرید) هاتووە لە خالیدی کوڕی وەلیدەوە بێ سەنەد.

## ئامۆژگاری -28-

تەکبیرات ووتن لەکاتی بینینی دوژمن سونەتە ([55])؛ لەبەر فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کاتێک (خەیبەر)ی بینی دەرچوون بەفلچە: (الله أكبر -سێ جار- خەیبەر وێران بوو؛ ئێمە ئەگەر دابەزینە ناو گۆڕەپانی گەلێک ئای کە وێران دەبێ سپێدەی ئاگادارکراوەکان) ([56])، نەوەوی دەڵێت: (لەمەوە بۆمان دەردەکەوێ کە سونەتە تەکبیرات بکەی لەکاتی گەیشتن بەدوژمن) ([57])، وە تەکبیر کردن پەیوەستە بەتێکڕای یادکردنەوە موستەحەبەکانی الله لەکاتی دیداری دوژمندا.

بەڵام لەئەبو موسای ئەشعەرییەوە کە پێغەمبەر ﷺ ڕقی ئەبووەوە لەبەرزکردنەوەی دەنگ لەکاتی کوشتار([58])، وە لە قەیسی کوڕی عوبادەوە دەڵێت: (هاوەڵانی پێغەمبەر ﷺ ڕقیان ئەبووەوە لە بەرزکردنەوەی دەنگ لەکاتی کوشتار) ([59])، هەروەها عوتبەی

٥٥ بگەڕێوە: (الفتح الباري) و (مشارع الأشواق)ی ئیبن نوحاس.

٥٦ متفق عليه.

٥٧ لە شەرحی موسلیم.

٥٨ ئیبن حەجەر لە تەخریجی (اذكار النووي).

٥٩ ئەبوداوود وبەیهەقی وحاکم بەمەڕفوعی گێڕاویانەتەوە، کە لاوازە حوکمەکەی، ڕاستیەکەی ئەو فەرموودەیە وەستاوە لەسەر ئیبن عەباد. وە تەبەری دەڵێت: (ئەوەی لەم فەردوودەیە وەردەگیرێت: کەڕاهیەتی بەرزکردنەوەی دەنگە لەکاتی دوعاکردن ،ئەوەش وتەی گشت سەلەفە

کوڕی ڕەبیعە لەڕۆژی بەدر کاتێک سەربازانی پێغەمبەری بینی بە هاوەڵەکانی گوت: (ئایا نایانبینن... لەسەر شێوەی مار هەنیسک دەدەن)( [60]).

وە کاتێک عائیشە لەڕۆژی جەمەل هاوەڵەکانی تەکبیراتیان دەکرد پێیانی گوت: (زۆر هاوار مەکەن؛ چونکە زۆرکردنی تەکبیرات لەکاتی گەیشتن بە دوژمندا لەئەنجامی شکستهێنانە) ([61])، کەواتە نهێنی پاراستن خۆی موستەحەبە لەکاتی گەیشتن بەدوژمن ئیلا مەگەر لەکاتی هێرشبردن ودووبارە کردنەوە وهەڵمەتەکان ([62]).

## ئامۆژگاری -29-

ئاگەداربە لەوەی شتێک لەغەنیمەت هەڵبگری بەبێ پرسی ئەمیرەکەت(غُلَّ)؛ الله تعالى ئەفەرمووێت: {وَمَنْ يَغْلُلْ يَأْتِ بِمَا غَلَّ يَوْمَ الْقِيَامَةِ} [آل عمران: 161]، هەروەها لە ئیبن عەباسەوە هاتووە: (غولول لە هیچ گەلێکدا سەری هەڵنەداوە ئیلا ترس وبیم ئەخرێتە دڵیانەوە) ([63]).

---

لەهاوەڵان وشوێنکەووتوان).

٦٠ واتا بێ هیچ دەنگێك، ئیبن عەساکیر لە تاریخەکەی باسی کردووە، وە هاتووە لە (عیون الأخبار) و (العقد الفرید) بێ هیچ سەنەدێك.

٦١ هاتووە لە (عیون الأخبار) و (العقد الفرید).

٦٢ پەرتوکی (صبح الأعشى في صناعة الإنشا، قەلقەشەندی).

٦٣ ئیمام لە پەرتوکی (الوطأ) هێناویەتی لە یەحیای کوڕی سەعید بە

## ئامۆژگاری -30-

وەسیەتێک لە اللە تعالی وە بۆ ئێمە پەروەردەی جەنگی تێدایە کە ئەفەرمووێت: {يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا إِذَا لَقِيتُمْ فِئَةً فَاثْبُتُوا وَاذْكُرُوا اللَّهَ كَثِيرًا لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ * وَأَطِيعُوا اللَّهَ وَرَسُولَهُ وَلَا تَنَازَعُوا فَتَفْشَلُوا وَتَذْهَبَ رِيحُكُمْ وَاصْبِرُوا إِنَّ اللَّهَ مَعَ الصَّابِرِينَ} [الأنفال: 46-45].

هەروەها وەسیەتێک لە پێغەمبەر ﷺ وە: (غەزابکەن لەپێناو اللە؛ کوشتاری ئەو کەسانە بکەن کە کوفریان کردووە بە اللە، غولو مەکەن ودەستدرێژی مەکەن وجەستەی کافران مەشێوێنن... )([64]).

## ئامۆژگاری -31-

زۆر نزابکەن بۆ ئەمیری ئیمانداران وپاشان بۆ برا هەژارەکەتان بەنهێنی؛ هەرکەسێ خەمخۆری براکەی ودینەکەی بێت ئەوا بێبەشی ناکات لە نزای سێیەکی کۆتایی شەو، ولەکاتی سوجدەکاندا، ولەکاتی بانگ، ولەهەمووی گرنگتر لەکاتی بەیەکگەیشتنی هەردوو ڕیزەکان، فضیل کوڕی عیاض دەڵێت: (ئەگەر نزایەکی گیرام هەبووایە ئەوا تەنها بۆ پێشەوا تەرخانم ئەکرد؛ چونکە ئەگەر پێشەوا چاک بێت

---

مەوقوفی لەسەر عەلی کوڕی عەباس -اللە لێی ڕازی بێت-، وە سەنەدەکەی لاوازە.

٦٤ موسلیم گێڕاویەتیەوە.

وڵات پڕ خێر دەبێت وبەندەکان ئەپارێزرێن)، ئینجا ئیبن موبارەک سەری ماچکرد وپێی گوت: (جگە لە تۆ کەس ئەم چاکەیە ناکات) ([65]).

## کۆتایی و دوعا

من دوعا دەکەم ئێوە ئامینی بۆ بکەن:

پەروەدگارا ئیخلاصم پێببەخشە لە وتە وکردار

پەروەردگارا چەسپاوم بکە لەسەر حەق و بۆچوونەکانم ڕاست بکە

پەروەردگارا دڵم نەرم بکە بۆ ئەوانەی تاعەتی تۆ دەکەن لەسەر حەق؛ وە توڕەیی وتوندیم پێ ببەخشە لەسەر کافران

پەروەردگارا من لاوازم لە بەندایەتیکردنت؛ چالاکیم پێ ببەخشە وبەهێزم بکە لەسەری، وە وام لێمەکە لە بێ ئاگایان بم

پەروەردگارا وام لێبکە لای تۆ گەورەبم، ولەدڵم ملکەچ وخۆبەکەم زان بم، وەلای براکانم خۆشەویست وبەڕێزم بکە

پەروەردگارا پەنات پێدەگرم لە پەنهانم وداوای شەهیدی ڕێگاکەت لێدەکەم وەداوات لێدەکەم لەبێئاگایی نەم گەڕێنیتەوە بۆلای خۆت، وە کۆتا خێرم بکە لەهەموو فەرمان وکارێکدا ئەی هەڵسوڕێنەری دڵان.

---

٦٥ ئیبن عەساکیر لە تاریخەکەی هێناویەتی، وە ئەبو نەعیم لە (الحلیة)، وە بەربەهاری لە (شرح السنة)، وە لالەکائی لە (أصول الاعتقاد).

